# پەستێن بازنەیی

هەلبەست

د. عارف حیتۆ


- چاپا ئێکێ
- چاپخانا زانکوا دهۆکێ 2001


## سێ بشکورینێن ژ رەنگێ ئاڤێ

### بشکورین-1

هێدی چاڤ زل
هێشتا دەمێ دل نڤستی
دەنگێ تۆپان وەك سنسلە دسینگێ مەخەل
هەستەك کەڤنار دمتبوونێدا
بژیێن کاژان ب گرنژینەك توزکەویڤە
گولچیچەکێن ژبیر نەکری
ئێکو ئێکو هە لێڤرین و وەریا نە ناڤ...
دووگوهێن بەل
هە موو رازێن نیڤ ڤەشارتی
ل ئاسمانی شین ئێورین
کوترێن سپی .... ستێر بەرزەکرن

ستيّران .... كوتر

ئەزیٚ سەرکە فتی دشەڕەکیٚ ژبیرکریدا

یاژمنڤە ... ژیان هەموو سەرکە فتنە

ب کوژیی ّ لیّڤیّن قەشا ڤیڤە ..،

گلیزیٚ کەل

ب شەرمینی خویا دبیت و خویا نا بیت

تو بیّژی کو ڤیٚ ئیّڤاریێ

پشتی دەڤیٚ تفەنگیٚ ساربوی ... ڤەمری

ئەزیٚ پیّتی

دیٚ گو لمچکیّن بەفریٚ کەم پەل؟ !

هەموو سحاری یّین پاییزی

بەندکیٚ سەربۆریٚ دقەتییّت و ..،

بیرهاتنیّن بیٚ دەسنڤیّژ

ب روییٚ خاڤیٚ به لگخەزاماںڤە هەل دبن .

هیّشتا یا مای:

چیروکیّن ... دەریا بو ماسی یا ڤەدگیّریت

ئاگریّن مت ... دپەرسگەهیّن خولییّڤە نڤستی ...

ئەو ئاگریّن:

راز ب گەوریّڤە بوین بلغەم

دیٚ دندکیّن شەرەکیٚ دی ...

ل بو هارەك نوی

ژداڤیّن رۆژیٚ ـ ئەویّن بوین کا ـ دیٚ بریّژم

ل بیرا تەیە ... ژڤانیٚ مە ؟!

گوهانیّن دارچناران شۆرکەفتن و.....،

شکەفت .... پیر بوون

سترانەکا نە گۆتییا بتنیٚ یا مای

لبن سیبەرا چووچکیّن شەیدا ....،

دیٚ بوتە بیّم

دوعاییّن سپی

پیرهەڤی بو دارکوکا دکەن

سپە لیّن قەدەرا کەچ ... بکە گو پال

توبەداری ... دەستا چاڤیّن تە ناکەتن

گەر تو بهێی... ئەز ژی دێ هێم
پشتی ئەڤینیەکا ژ دوور
ئوو...
هەموو ئێشان بوینە بلوور
بشکورێنین تە یێن دوو سوی
چاڤەکێ من دکەنە گونەهـ
ئوو...
چاڤێ دی دکەنە تەنوور
ئەڤجا وەرە
هەموو ئوردی یێن تە سۆتي
هەموو جڤینێن تە گۆتین
تەڤ چەوتی یێن بوینە هیزار
ئوو...
ئەنیا تەیا ـ هەتاڤ لێ باری ـ کرییە شەڤ
بکە ستڤانك وبدە بای
درەو رووبارەکێ کەڤنە
ئەز دزانم ...
دکرێترین سەرکەفتندا هێژ تە ئەز دڤێم
ڤیانەکا ئەفسانەیی
یانیڤەك دڕ
ئوو..
نیڤەك گول .
*

## 2. بشکورین

هێدی چاڤ زل
هێشتا دەمێ دل نڤستی
هە موو خۆشی ژ بانێن بلند پێکڤە وەریان و ..،
بونە زل
ئاگرەکێ دهنا ڤێن مندا دەڤ بەشە

خەریبیەکا نەحەجمتی ..،
هەموو لەشێ من دخوراند و پاتۆرێن بەفرێ ..،
بژیا من، کر بوو هێلین
هەڤدیتنێن پاش ئێخستی و هەموو سوزێن بجه نە ئینای
پرت ـ پرتە ..،
ژسیلا ڤا بیردانکێ دوەشین
ئەز بێ سیتا فك ...دێ کیڤە چم !؟
رێکێن چۆلکری وبەستی
مالێن ڤالا
دەمێن خۆشێن هاتین سۆتن
ژیێ ... ب بێهودەیی دهێتە مێتن
ئوو...پەیمانێن ژڤەستی
چ دی نینە ... ژبلی مرنێ
بەرزەبوونێ
ژهەڤ دووربوونێ
ئوو...
بیرهاتنەکا کەڤنا خەمگین
دناڤ مژێ و ئاگریدا ل خوە دگەرێیت.
......
لبن مژیلانکێن تە، هیڤیێن کەسك بوون
ددانگێدا شوکا من ...
لەشەکێ وەستیایە و دوودلیێ نیڤەك کەرفتی
ئوو...
تەڤنپیرکا خەونێن مە رستن
هەلامەتێن رێکا دیتنا تە رووڤی بوون
لێ ، ئاخویرکا هە ڤدیتنێن مە ڤەکوشتن
تو کیڤە بچی ..!
ئەڤینی و کەربڤەبوونا من دێ دگەل تە هێت
جارنا سترانێن شەرڤانان
جار سترانێن پێریڤانان
ب دەڤەکێ هێشتا ساڤا دێ بو تە بێت
مەشکا دناڤێك بوهژینا مە ..،

ئەھر ەمەن یان مەزدا دێ کێت ...

لێ یا مە دڤێت

گوللا... نەڤێت

ئێدی ئەم ھەڤدوو نابینین

دھەر دوو چاڤێین حەزا مەیا سەرمەدیدا

نەسۆز ما

نەدۆز ما

نە ئەو ماچا بێ گونەھ و دلسۆز ما ....

بتنێ مرن

بتنێ مرن

دبیتە سەرمیر ا ھۆزانا و دبیتە ھەڤبین.

.......

ئەز دێ دەرێ ھزرێ گرم ..،

دا تەڤ کوڤان سەربەردای بن

ئەز و کوڤان پێکڤە یێن بوین و مەزن بوین

ئوو....

کوڤان ... نە دھە ڤال ھێلن

دێ سەر ژنوو دیرۆکا خوە ڤەوژێرم

دێ خرڤەکەم

ب ئەنیا منڤە ..،

رەھەندا مرنێ و کەنینا نەسرینا

لسەر کاغەزێ ..،

کوما برینا و ڤەژینا بشکورینا

ئەز دێ سترانا پێلێن خورت بێژم

بو وان زەڤی یێن ژیان لێ وەك گۆرێن کۆلای

بو ماسی یێن ... ب مۆرفینی ھیدای

بو وان پەیڤێن ویرەکێن ..،

بچووك بوین و بوینە رەمل

پێلێن خورت ژی درەوەکە ...

وەك درەوێن، عەڤرێن رەش و

کەنیا خوەش و

ستێرێن گەش و

ئەڤینیا شل

ئوو....
ژڤانیَ هەڤدیتنا بیّت.
......
ئەم دخوەدا هەڤدژین و ژهەڤ رادژین
تەڤ سەرکەفتن هەلیّڤرین و شین بون برین
ئەڤ دانسالیَ پاییزیّیە
بیَ مکیاج
بیَ کلچیڤ
بیَ کل
سترانا دبیّت
شکە ستن ژی خوّشییەکە ... هیّژ پر گومان
ل شوینا هیڤیا بکەینە هیّلین
بە لگیّن ژبیَ مە وەریان و ئیّك ئیّك بون گل
لیَ تو دزانی ...
دجوانترین داکە فتندا هیّژ من تو دڤیّی
ڤیانەکا ئەفسانەیی
یا نیڤەك درِ
ئوو ....
نیڤەك گول
*

## بشکورین ـ 3

ئەڤروکە نەورۆزە
هە ڤالیَ من ....
ئەویَ ب رەخ منڤە بویە وەك گومتلەکیَ ...،
بەفریَ ویەلا
خەرزیَ خەما و گرنژیّین ڤەمری و خەلا
ترپیّن دلیَ وی دسینگیدا، چارگاڤیَ دکەن
ژترسیّیە ... ژخوّشییّیە
یان ژی ژگومانا دیتنیّیە

ئەز پێ دهەسیام ئەو ژی وەك من ئە ڤینداره
زێماری ئەم گەهاندین ئێك
حەلاندن ژان ... كورتكرن رێك
لێ وەكو من .... مرن دچاڤاندا بوهاره
......
من چ مایه ژبلی گۆتنێ
تەڤ گوننەهێن ب ئەنیا منڤە بوینە ئالا
دناڤ ئاورێن لەهیەكێدا من ڤەشارتن
نووترین خاترخواستنێن سپی و نە ژدل
ب لێڤێن من یێن سیس و پێتیڤە بون خەمل
بیرا تە دهێت
دەمێ ئەم هەردوو دسنێله
رۆژا نەورۆزێ ... هێلێن و مالا مە بوو
گرنژینەكا .... عاشق و هەستێن فیریای
پستە پستەكا سادە
بێ گونەه
بێ پاشكو
هیڤیا مەبوو...
چاڤێن تە شاپەرێن ئومێدان بوون
ئەز ژی تیرۆژكەك مشەخت بووم ...
دچاڤێن شەڤێ وپەیڤێ و رە فێدا ....
ژبەر هندێ بوو ... تەڤ سحاری یێن سەرێ سالێ
ئاگرێن گەش دبوونە بەخچەو ,
تو...
دبویە فەزایێ هەمی هیڤی یان و
گۆتنا ن و
لە پیزتنان
تو دبویە ڤەرێژ و بەرمایكێن عشقەكا نۆژ
ژهەیڤێ بوی وب رۆژێ فرشك كری ....
بیرا تە دهێت
دەمێ ئەم هەردوو دسێله
تەڤ چیڤانۆكێن عاشقان مە ژبەر كر بوون

تو .. زینەکا زینکری بوی
ئەز ژی مەمێ زیندانا و .... بریارێن پل .
.......
کراسێ تە
ئەوێ ژچیکێن بارانێ وگەشاتیا پەلا
ژسەردەستێن من وەکو پێلا دهاتە خوار و ..
دبوو بازەبەند
دڤەمراندن تەڤ نشتی و تابرکێن کەسك و ..،
حەماهیلوکێن مەلا
تەچ ڤێ مایە بێژییە من ...
ئەزێ فرِی دناڤبەرا برینەکێ وئێکا دی دا
ئاسمانێ شین وسامالێ ژستێر ا سل
من قەتکر و ..،
دناڤبەرا خوەیی و مرنێدا پارڤەکر
ئا سمانێ پان ... دووانییەکێ فەیروٚزییە
ئەز و تو
مرن و ژیان
هاتن وچوون
دی ێیت و بوو
دەنگێ ئاڤێ سترانەکە من گوهـ لێ دبیت و دئازرم
رەنگێ ئاڤێ بەللورەکە، ئەز حەز ژێ دکەم و دهەلگرم
ئەز ...
ئەوێ برین کول
رویێ ئاڤێ پر برین دکەم
ل ئێڤارییان ...
دگەل ئێڤاری ل چایخانەکێ مالخولیانێن خەمر دکە ین
پاشی دنڤم
ما چەوا خەو من دکەتە مال ؟!
ستێر نانڤن ...
.....
وەکو خەونێ ییێ هاتیم و هەروەکو خەونێ ژی دێ چم
وەکو خوٚشیێ ییێ مریم و هەروەکو خوٚشیێ ژی دێ بم

مرن و ژیان

دچاڤێن مندا هیڤییەکا خوینەلویە

ئەگەر ئەز بێم یان ژی بچم

چ بوهارێن دی یێن خەملین دچاڤێن تەدا نا حەوینم

هەمی ئەوێن هاتین ... خۆشیا ژینێ و بوونێ بینن

وەك (ا یس کریم ) ێ ل ها ڤینێ ... دحەلێین

دحەلیێن ... دحەلیێن هەتا دمرن

مرن .. مرن .. مرن

پەیڤەك کرێتە و ئاییردەك پر هەیبەتە

گومانە و... باوەرییەك پر زەحمەتە

لێ ب ساناهی ئەم ڤەدجوین و،

ب ساناهی لسەر لێڤێن مە دبیتە ستران

هەر دێ سترانا بێژم و ل هیڤیا تە ....،

دێ مینم هل

چنکو دزانم دسەر مرنێ را.... هێژ تە ئەز دڤێم

دسەر گومانێن پە رڤەکری و دیتنێ را ... هێژ من تو دڤێی

ڤیانەکا ئەفسانەیی

یانیڤەك درِ

ئوو..

نیڤەك گول .

*

1998

## ئەو هۆزانا تەمام بوی و... هێژ نەتەمام

بو من گولەك

بو تە گولەك

گولله ...ب لێڤێن بەفرێڤە بوو نێرگز

عەڤران دادا ... ب سینگێ زەڤیێڤە نڤستن

هەموو پێژن ... ل ریشالۆکێن دەمی سواربوون

سینگێ سیریسێ پر ژانە

رەهێن ژانان ڤێژی یێن کوورن ....،

يێن ڤێژیا ژان
خۆشی ... دسندوقا پندۆرایێدا ....،
ب رویسی دکەنیت

تبلێن من یێن بوینە جادە وب سەربەستی ،
سپەهـ لیێ دمەشن
پرچا من یا بوی دارستان ...
....
ئەویێ شەرڤان
یێ دزڤرۆکا دوودلیێدا
کوڤان کوڤان کەزی یێن دیرۆکێ دڤەهوونیت
ئەگەر هات و ئەڤجارە ژی (شکەس ە رکەفتن )،
ببیتە دیلان
گوپالێ من دێ کورت بیتن
ئوو...پندۆرا تبلا خوەیا شەهدیێ ب مێژیت
دقەهوەخانا شێخ سەعید ڤە
فاتحە میرە و هەموو میرێن دی درەون.
....
ئەویێ شەرڤان
پرچا وی نیڤەک باژێرە و ... نیڤ دارستان
یێ دووکەر بوی
کوتران مەژییێ وی رەڤاند و هەموو کولان
گلوپ گلوپ بیردانکیێ داخ دکەن ودگورێن
لەشیێ یارا وی یا نازك
بسترینا چەند چووچکان
پەنجەرەکا مشتی ژڤان
چاڤێن وی مومکن ... چرانە
لەشیێ تفەنگیێ گرانە
ملیێ وی یێ پێتی کری و ....،
دەستێن وی یێن بوینە کورتان
گەر ئەڤ شەڤە، ئەز دربەکی نە وەشینم
هزاران درب ، دێ ناڤ لنگێن من کەزێخن.

**- کەڤالەکێ ژنشکاڤە**

**" نێرگزەکێ پەیمانەك بەست دگەل قا فکی**
**نێرگزێ ... نێرگز جەماندن**
**سویێ قا فکی یێ دەرزێت**
**ژووردا دبیت سەر**
**ژێردا کوری**
**سەربوون دیوار**
**نێرگز ڤەژی**
**قافك شکەست و ... بو بستری "**
**کەسەك لێڤێن خوە شۆر نەکەت**
**باران دێ هێن**
**مە همەدرەشا دێ ڤەژیت و...**
**جوبیتێر دێ بیتە پاپۆر.**

**- کەڤالەك ژبیردانکێ**

**" هەر جۆرەکی نێر و مێیەك**
**هەر ئوردیێ نان و خوییەك**
**بژیێن جۆدی یێ هەل دبن و**
**پاپۆرا مە یا دحلیسیت**
**مەمکێ کەسکاتیێ دبشکڤیت ..."**
**ئەوێ شەرڤان**
**ئەوێ تفەنگێ ملێ وی ب خوٚڤە گرتی**
**ئوو... خویلکری**
**مەژیێ وی یێ بویە بەخچە**
**ئێدی نەما ... رۆبۆت بژیت**
**ئەز ژی وەك تە بریندارم**
**هەر ئێك ژمە وەك خوە دنالیت**
**نالین سەرێن مە دکەتە جووت.**
**....**
**بو من گولەك**
**بو تە گولەك**

گولله ... ب لێڤێن بەفرێڤە بوو نێرگز
نێرگز اتی ژ دێمێن مە هەردووا دباریت
تو بێژی کو ئەڤ شەڤە ژیك
وەك تەڤ شەڤێن سەرخۆشیێ
پەیڤێن مە ژگەوریا پێکا بن
پەیڤ
پەیڤ
پەیڤ
ژپێنگاڤان شین بوون زریان
وەلات وەلات یێ ل پفەکا بای دگەرییێم
ژبو دەنگێ بکەمە کوتان .
....
بو من گوللەك
بو تەگوللەك
گول .. ب لێڤێن ئاگریڤە بوونە شەمالك
ئەڤ قونێرە دێ دەربیت و
هە موو ئێشان ...
دێ ژستوینا ئالای وەرێین و ....، بنە سیبەر
چاڤێن ئۆزۆریس یێ ڤەدبن
چاڤێن وی ژی ...
سو حبەت خوشن.

*
1998

## ئەو زارۆکێ بویە بازنە

بومەکێ کال
لسەر تێلێن سارێن کارەبێ
سترانەکا دنەهشسیێ دا بو هشیاریێ ڤەدلورینیت
هەکو خاتوون دندکێن دیجلەی دکو لندکاندا ....،

ڤەدشێرن و

سپەھ دناڤ پرچا خەجێدا ... سەمایێ دکەن

کەنییەك بەلی

سۆزەك کەلی

ئەڤینییەك نیڤ ڤەشارتی و نیڤەك زەربەلگێن پاییزی

دێ نێرگزەکا دی چینم !

ل دەمێ بوھار دقا فکاندا دبنە گویین

ئازریان ... ب پێنگاڤانڤە دبنە لیلاق

سیلاڤێن مانێ و نەمانێ .... لبەر بارانێ

کەزی یێن گومانێ دڤەھوینن

"ئەگەر ھەبم ... یان ژی نەبم"

ھەردوو چاڤێن خەوارەیی یێن تەناھیێ

لسەر گویفکەکی زل دبنەڤە و دغای دچنەڤە

- تە چ دڤێتن

خەونرۆژکەکا تلیاکییا ھێژ گومانێ ماچ نەکری

ببیتە بەندکێ تا برکا و ....

ب زەندێن ئیفلیجڤە شۆر ببیت

تەڤ ھۆرەبا یێن بوینە پف

دناڤبەرا ھەیێنیێ ونە ییێیێ دا

ئاوازەکێ سەرژێکری و رو وچك مارە

ئەو زارۆکێ وێ ئێڤارێ ژ واجبی زڤرییەڤە

چاڤێن وی گورگن ... روییێ وی سارە

رێکەك درێژ یا ڤێر کری ..

ھەردوو لایێن وێ تەناھی

پێنگاڤێن وی دخورینیت وبەرێکێن وی مشتی کوشتن

کوشتن

کوشتن

دکاملانا کەربا کەلاندی و کەرفتی دا

دھەمبژاھیڤیا ھەلاندی و ھەرفتی دا

دخاچدانا خەما خەمرا خەرفتی دا

سترانەکە ...

چ لاندك پێ ھاویش نابن

....

ئەو زارۆکێ وێ ئێڤارێ چوی واجبی

دلێ وی یێ بویە ترێن ... دجامێرا

ژیان یاریۆکەکا سەیر ە وئاسوەك مشتی بوهارە

مێرگێن خەملین

یاریگەهێن هەمەرەنگ و کەنیا شرین

پەیڤێن خۆشێن ماموستایان

چانتە و دەفتەر و خامە یێن جوان

سەما

ستران

ڤیان

ژنشکەکێڤە هەلنگڤت و کەفتە ناڤ غەبرەك تەناهێی

تبلێن وی یێن هەمی نێرگز ... دئاخێ وەربوون

هزرێن وی یێن بەهەشتوکی .... سیس و زەر بوون

کێلبەتیژێن تەناهیێ و

بێهنا گەنیبوونا لەشان

تەرازیا خێر و گونەهان

دێ چەوا گەهمە دادوەری ؟!

....

هەرۆ سپێدێ .... بومەکێ کال

لسەر تێلێن سارێن کارەبێ

سترانەکا دهشیاریێ دا بو نەهشیێ دڤەلورینیت

ئەو زارۆکێ بێ گونەهێ

هەردوو چاڤێن وی ئاسمان و رویێ وی رۆژ

هێژ نەگۆتییە ... چ کچکێن گەرم

" وەی ی... بەژنا تە چەندیا جوانە!"

هێشتا چ خەون ...، نەب ماچا و

نە ب هەیڤێ و

نە ب ئە ڤینیێ

نەدیتینە ...

دوهی سپێدێ دناڤ تۆرا تەناهیێ دا

خوینا دلەشێ ویدا بەستی و یێ نقستی

ئەڤ بومێ کال
ئەوێ لسەر تێلێن سارێن کارەبێ
ئەوێ ... سترانەکا خەمگین
نەء ... ئەوێ سترانەکا کەیفین
نەء ...ئەوێ سترانەکا نزا چەوا !؟
دنەهشیێ دا بو نەهشیێ دڤەلورینیت
بابێ وییە !!
....
ئەو زاروکێ بابێ بوم
نە بو چووچك دبەهەشتێدا و...،
نە گوننەهبارێ دوزەخێ
هەردوو دەستێن وی بزوتن
جارنا شەڤێ دڤەرەڤینیت
جار ژی ژیانێ دسوژینیت
ئەڤ زاروکە ...
یێ بابێ وی بومەکێ کال
یێ بوی بازنە و لدور خوە دزڤریت .
*
1999

## پەستێن خوداوەندا و ژڤانێن خەموکی

**پێشکێشە بو هەڤالێ من ...**
**ئەوێ ئەڤینییەکا ئێک لایەنی دگەل ژیانێ هەی**

نێرگزەك و
هندەك پارچێن ئومێدەکا پرت پرتکری
چەند روندکێن چاڤ ژێ شەرمین
بوهارەکا پلا ستیکی دقافکەکێ دەرزیدا
ژنشکەکێڤە، هەموو پەیڤێن رەش و خەمگین
لسەر مژیلانکێن بێ خەوێن من یێن لەرزوکدا ئێورین
پاژو... رەڤەندێ ژڤانا
پەست

پەست

پەست

هەموو پەستێن خوداوەندا وحنێربەندا و هەڤالبەندا
بون گردانەو ... ل ستویێ بوهارێ ئالزین
دفارگونا ناڤەراستا ترێنێ دا
ئەز ...
تو ...
کەسکاتییەك
خوداوەندێ سەرخۆشیێ و با و بارانێ
یێ خۆشیێ و شینکاتیێ و مرنێ و زانێ
بێهودەییێ دچاڤێن مەدا سەما دکر
رێکەك درێژ هەردوو لایێن وێ ستری لێ
خەمەکا ڤەشارتیبا هێشتا بچووك ... نە ترکی
لبن مژیلانکێن وەستیای وتێر خەو نەبوی
هێکێن کەسك وسور و زەر و خەمر دکرن
گوهێن ژیانێ دشرن
لبەر بارانێ وکەنیا فێلبازا نیسانێ
" هەکو خەم دبن ... خەم مەزنن "
خەما من هندی جیهانێ
نەچاڤێن تە ئیرو دزلن هندەکا تێدا ڤەشێرم
نەئومێدەك ئێدی مە مایە ل زۆزانا
نەژی ترێن رەحمێ ب پەیادەیا دبەتن
پاژو.... رەڤەندێ ژڤانا
ژیان ... تێن و گەرما هەتاڤێە ل زڤستانێ
کوڤان ... سیتافکەکە ژخودانێ خوە درێژ ترە
تو چ دبێژی
ئەز و تو ژی، ل پشتا عەڤرەکێ بارانی...
سواربین و ژبلنداهیێ هێڤکەینە مێر یا و شیانێ

– باگراوند
دوو زارۆکێن خوین گەرمێن سنێلە بوین
رێکێن کولانا و بەردەرێ خواندنگەهێ

شەرم ژپێنگاڤێن مە دکر و
ئەم ب پێنگاڤڤە مشتی گڕ بوین
دوو کێڤر ووشکێن ساویلکە و کووڤی بوین
بارانێ پرچا مە دشووشت و گەرما ئاگرێ نەورۆزێ
ماچی دکرە روێن مە یێن قەرمۆکی
ڤیانەکا نەپەن ....
ئوو حەزەکا پر خەمۆکی
ئەو هیڤیا دسینگێ مەدا بو ئازادی و ئاڤاکرنێ
بو خۆشیێ و نوژەنکرنێ
دکەلی .... دکەلی و دبوو ڤولکا ن
ئەڤ وەلاتە دێ رزگار بیت
باژێرەکێ هەمی نێرگز مشتی ڤیان
لسەر دەستێن مە دێ بیت ڤیان
- ل زڤرینەڤێ
پرتەکا من ب لەشێ سپیێ تەڤە نووسیا و
ناڤێ تە وەك گومتلەکێ هەستا فیریای
ددلێ مندا ببوو هۆزان
پاژو .... رەڤەندێ ژڤانا
دفارگونا ناڤەراستا ترێنێ دا
هزاران بشکوژ ڤەدبوون وگول دوەریان
ئەو باژێرێ مە ژێ دگۆتی .... بو رێلستان
نێرگز بەهین
هیڤی حەلیان
دغای چونەکا سڤك ... چاڤێن من گرتن و تو پەیا بوی
من نەزانی ... کیژ دانانگەهێ تو بری
تەئەزهێلام وپارچەکا دلێ من یا دچاڤێن تەدا
خر بوهاران هەناسا تە...
ژفریزێ باخچێ مە دزێتن
بێهنا تە ژپەیڤێن مە دهێتن
پاژو... رەڤەندێ ژڤانا
خۆشی یێن هێشتا نە هاتین
ددلێ منددهەلگرتینە

چەند پرتکێن دلێ منژی
دچاڤێن تەدا دنڤستینە
پاژو ...
*
1999/4/27

## عەشق ... هۆزانەکا سەیرە

سپێدەیەکا هاڤینی بوو
لسەر تبلێن عەبەسی یێن پی یێن زریایی
هەمی هیڤی یێن ڤەشارتی و پەیڤێن گومانکی
ژدارستانەك بێ پێنا سە .... بو ئێکا دی
وەغەرێن سار و گەرم دکەن ... چەپ و راست
دارستان : بەرزەبوونە
بە رزەبوو: ئالۆزییە
ئالۆزی: گومانە
گومان: لێگەریان
لێگەریان: گوهورینە
گوهورین: یاخیبوونە
یاخیبوون: دارستانە
ئەڤ رەشەبینیە ...
خلفا سێدارێیە سست بیتن و... دوەرمیت
....
سپێدەیەکا هاڤینی بوو
بەلگێن چناران
کەوپرکانێ دگەل بای دکر و دەنگێ سترانێن سیلاڤێ
ئایەتەکا نهێنیا رووچك سوورە
هێشتا چووچکان چاڤێ سپێدێ ماچ نەکری
بلبلەکی دادا سەر تاکەك دلێ من
هەربستری ... هەر بستری
ئاسمان هەژیا وکانی دەربوون
لبن سیبەرا دارهەژیرەك بناڤ سالڤە چوی

عەدەم کەفت و ئەڤین ڤەژی

ئەڤین: هەستە (هەستەك نازك)

هەست: ئاریانە

ئاریان: لەزەتە

لەزەت: خۆشییە

خۆشی: ژیانەو ... ژیان ئەڤینە

ئەڤ گەشبینیە ..،

هنارەکا نەکەرکرییە دپاخلا مندا .

دویّ سپێدا هاڤینیدا، ئاڤا رووباری ب نەرمی ژهەمی کانیکا دباری، سترانێن چووچکان و شنەبای، چاڤێن من خستن سەمایێ، منژی وەکی چووچکا کەفتی ئاڤێ، دلەرزی، دفڕی،خەیال هات و خەیال بوری، خەیال نەهشییەك جوانە، ب تەناهی ملیّ من ییّ پان و پر زام کرە هێلین و خەم مرن...،

هەمی رەنگێن ژێکڤە قەتیای

هەمی دەنگێن ژئێك دلمایی

هەرکاروانیّ ل نیڤاریّ مایی

دسینگیّ مندا مەخەل بوون وئاراستەیا وەغەرەکیّ بەرەف دارستانیّ ڤەکر، پێناسا من ددلیّ دارستانێدا ... یا نڤستی و ئەز پێناسا دارستانیّ، ب دلەکی خەریب و یەکبوی، مە بیری یێن بوری دکولان...،

هەمی کو لیلکێن یاخیبوی

هەمی پشیکێن ئاڤز بوی

هەمی تەنوورێن کەڤنبوی

چاڤێن من یێن خەوتە هەل دکەن ... دڤەمریننەڤە، ئەز ئەزەکیّ خەمۆکییّ دوو دلییّ کریە کەنگر پەر، دکێژان فارگونێدا بژیم ، رێژگەهـ ئێکە ... من دڤیا بازدانەکا بلەز لسەر دەمی بکەم ...، پر ژبازدانان دترسم ... من دڤیا رێزەکا دی لسەر شویرهیّ ئاڤاکەم و شویرهە لبن پێن من کند ببا ... ئەز نزانم هەتا چ رادده ب ئاخێڤە گرێدایمە, هەمی جورێن گرێدانیّ ، پێنگاڤێن من (ئەوێن نووخواز) فالنج دکەن و نە دیارییّ دکەنە دۆزەخ (ئەو نە دیاریا ئەز لیّ دگەرییّم) .. بریارەکە و دڤێت بەردەم ... دیّ هەبم, یان نە ..، ددوانیا هەیینییّ و نەیینییّ دا ب هزاران سالێن خرش و سا لێن ئاڤز یێن بارکرین ...چ بکەم ها ملێت مر و گومان ڤەژی ... هەمی تشتان تام و رەنگێن خوە گوهارتن ....

د ویّ سپێدەیا ها ڤینی دا...

نارینەکیّ دادا سەر پەنجێن دیتنیّ

نارین ... بەنازەکا چیایی یە و چاڤێن من یێن برسی و دامای

چ سیبەران لبن گوهێن ویّ - یێن کیفکویی -

ناچێکەتن...

سەربازێن لەشکەریّ عشقیّ ب هەیبەت و کوباریڤە

شکەستن

شکەستن

شکەستن

چەپەرێن ڤالاهیێ گەرمن

ئێدی ... دکومتا شەپرزەیی یا لەشێ تەبگرتی و...,

بێگونەهیا گیانێ سار و دۆراندی

سەفەر ... ڤالیومەکا ئێکسپایرە و

خەوێ ل چاڤێن من ناچینیت ...

نارین:

بێهنا ئاخێیە و خوناڤا گولان

روناهیا ژینێیە و لێدانا دلان

هەمی تشتێن ڤێ هەبوونێ دلال وخرشن

بتنێ نارین ... گەرم ژێ دباریت و دگرنژیت

نارین ... هێدیکا لسەر مژیلانکێن منرا وەرە

نەکو چاڤێن من یێن کولبوی فێلبازی یێن تە

ب بینن و... ئێدی سینگێ تە یێ رویس

من دسەردا نەبەت

دسەردابرنا تە ژی خانم ... خۆشییەکە

دڤێ ژیانا هەمی تشت لێ ...، ژبلی خۆشیێ

ئاخ ... من چەند تو دڤێی

هەمی ڤیللا و باخچە و تەلارێن ڤی شاری

هو ب ساری ... یێن کاڤل بوین

بو قچکەکا قەرەچەکێ

حەزەك دژوار

سترانەك بریندار

سوزەك نەساخ

ئەڤینی یا وارەکێ ژدەستدای

ڤی با ژێری دکەنە گولتە و خر ئەخت وباری درەون

حەسویێ شڤان (1)

بلوورا وی وی سەرخۆش کرن ئەرد وئاسمان

پەزێن وی هێشتا د خەون

واریێ ژدەستدای: سترانەکا بریندار ە

سۆزا نەساخ : باژێرەکێ ب گولتەیە
گولتە: هەژارییە
هەژاری : حەجی قاسمە (2)
حەجی قاسم
ئەی پیرۆزترین جهێ ڤیستەڤالێن خۆشیێ و تەناهیێ
ئەز ددلێ تەدا ... نڤستیمە و ژ تە یێ خەریب
نە من جرعەتا سمیتا خەونێن سەرمەدی هەیە و
نە کاروانییان جرعەتا ژینێ ...
کاروانی هاتن و بورین
تەڤ خرخالێن دناڤ کاڤلاندا بەرزەبوین
پێ ل ئەڤینی یا من و نارینێ دا و بورین
هوین دزانن ... چەند یا خۆشە
هەمبێزکرن , دناڤ کا ڤلێن هشك ولالدا
لەرزینەکا وەك تەزینکێ
دلخاڤبونەك وەك یا برسی
چاڤزیق بونەك وەك یا ترسێ
دکاڤلێن کالدا, قەرەقۆشەك دچاڤێن مەدا
دێ ڤەژیت و ژبلنداهیێ دێ هێڤکەینە ,
مێری یێن دەلال
....
سپێدەیەکا هاڤینی بوو
هەمی دەنگێن گەوریا رۆژێ من کپکرن
هەروەك چەوا خەونەك مەزن , بەری ئێڤاری
دمریتن
یان حەزەکا هێشتا شیرخۆر
لسەر دەڤەکێ خەندقاندی و دناڤ پەرداخەکێ دیدا
بشکورینێن هێشتا ساڤا و گەلەك پەیڤێن هێژ نەگۆتی
بێ دەنگ بورین ...
سلاڤەکا سەرپێ و ژدوور ڤە
چاڤێن من کرنە قەنتەرەو
هەمی هەسپێن حێنج و یێن خەوتەیی... بورین
ئەزچ بێژمە یا خیبو یێن سەر شوستەیان

هەناسەیا شەڤێن سەرخۆش مژیلانکێن من دلەرزینیت

سەرسوبەهییا شوستە یێن هێشتا نە زاڤا

گلیزانکێن خەونان ڤەدکەن

ئەی خامەییٚ خەمجڤینیٚ خەندە خەریب

ئەی ... ئەویٚ تە مزگینیا ئەلندیٚ دای

عەمر بوری و ئەلند نە هات

ئە نی کەسك بوون ... سل بوون خەلات

ئەی ... پێژنا مرنیٚ

ئەی ... کێلبێن رەش ونەرم

ئەی خەون

ئەی حەز

ئەی دۆژمن

ئە ی ژیان

سوباهیا من نە ڤە مرینە دناڤ رۆناهییا دوهیدا.

رۆیێن رۆژیٚ دپێندڤیا ینە و گرنژینەک ئەرخە وانی تبلێن من یێن زڤر و پێتی دبای وەردکەن, هەمی پە یڤێن ژفەرهەنگیٚ یا خیبوین و بتنیٚ هە ڤرکییا مژیٚ دکەن , ب شەهنازییێڤە خەندقین, کیژان ئەڤینی خۆشترە: چاندنا ل بەندا دیتنیٚ یان ژی دیتن ..., کیژان گونەهـ مەزنترە : کەریٚ پەزی نڤستی بیت یان ژی شڤانەک خاپێنوک ... دیٚ چەوا ڤان هەمی خەونان ل حەزرەتا رۆژیٚ دخەو بەم و بو ماوەییٚ سلاڤە کا بلەز و سەرپیٚ ..., لجەم تەروینم ...

دەمەکیٚ گیانییٚ پوخت

بیٚ پەیڤ

بیٚ کامیرا ڤەشارتی

دووری هەمی جهێن هەلبژارتی

دناڤ دلیٚ باژێریدا

ئەڤینی روییٚ دی یێ مێرانییٚ یە , ل دەمەکیٚ بارکرییٚ ب هەمی تشتان , ژبلی مێرانییٚ ... من چ تشتێن نوو نەماینە بو تە بێژم ... گۆتن یێن بوینە گەنم و خەلک بازاری پیٚ دکەتن ... سیبەرا دار چنارێن پیر خوهیٚ ب لەشیڤە دکەنە خویٚ , وەغەرکرن دناڤ پاپۆرا تاناتوسدا (3) سەنتا ڤەگەرێیە بوناڤ زەیتونستانان , بوهژین دناڤ حەزێن فیرپایی یێن ئیرۆسیدا (4) وەغەرکرنە دپاپۆرێدا بەرەف سەنتا شەڤستانان ... ما تو دکاری چەند چرکە یێن دی گوهدارییا پەیڤێن من یێن شەیدا و شێتاوی یێن تاگرتی بکەی ..., نارین: خۆشی ئاڤروویەکا بلەزە, ناڤەگەرییێت , ئەگەر تو بیٚ گوهی... دیارییەکا ڤان کوخی (5) یا ددەستیٚ من یێ چەپیٚ دا هەی ...

سپێدەیەکا هاڤینی بوو

نە نێرگز دهشیار بوون, نە چ پەیڤێن نێرگزی !

بەژنا نارینیٚ... خوداوەندیٚ خۆشییٚ بوو

بششکورینا وێ
لێنێرینا وێ
چون ومەش و ڤینا وێ
دخوینا مندا جوبیتێرەك (6) یێ بەنجکری ونڤستی بوو
ژبونا کو پێنگا ڤێن من خاڤ نەبن
ئوو...چ ستری دپێ من نەچن
ئاورەك دوودەقیقەیی
بتنێ... بتنێ دوو دەقیقەیی
ببیتە مێڤانێ ئاتاڤێ / عشقێ
دناڤبە را چاڤێن مە دا تەحسینی (7) ستران دگۆتن
هەمی سەربورێن ئەڤینێ بونە چەتر
گەهینا مە بو جارا بێت
سورگولەکا پەر وەریایە ل خزیرانێ
عەشق ... هۆزانەکا سەیرە !!
*
1999
دەهمەن

---

1ـ حەسوێ شڤان: پەهلەوانێ چیرۆکەکا فولکلوریە , دەمێ بلوور لێددا پەزێ وی هەمی لێ خرڤە دبوو.
2ـ حەجی قاسم: ناڤێ گورستانا گوندێ هۆزانڤانییە.
3ـ تاناتوس: غەریزا مرنێ.
4ـ ئیرۆس: غەریزا ژیانێ.
5ـ ڤان کوخ: ئێشا رە تە بو هونەرمەندێ نیگارکێش فنست ڤان کو خ , ئەوێ گوهێ خوە بری و کرییە دیاری بو دلبە را خوە.
6ـ جوبیتێر: مەزنێ خوداوەندایە دمیتۆلوژیا گریگیاندا.
7ـ تە حسین: ئیشارەتە بو هونەرمەندێ سترانبێژ (تحسین گه), کوردە ٬ خەلکێ دەڤەرا ئامێدیێ یە.

## گو مانێن مۆر

ئەڤ باژێرێ هوون دبینن... لەیلانەکە
دچاڤێن خازۆکدا دبشکڤیت
پێژن ... یێن بوینە هورەبا و ....,

بێدەنگی لسەر لێڤێن من یا بویە بیشە تگ

ل بنی ... ل بنی

لسەر گویفکەکی

ل پالا دیوارەکێ هێتیم

لبەر دەرێ خوارنگەهەکێ

لسەر شوستە یێن ڤالا ژکەسا و

مشتی جەستە یێن سەرابی و گو مانێن مۆر

ئەڤە ژ مێژە سیتافکا وی کەسێ بەرزە

یێ ل خوە دگەریێت

داخوە دچا ڤێن مندا ب بینیت

ئوو... ئەز

ئەزەك خەریب و بیانی

بەریکێن من دڤالانە

نە چ حەبکێن ئارامکەر

نەچ ئەدرەسێن مەیخا نا ... و,

نە سیبەرا پرۆستەکێ چاڤێن من یێن دخەوچوی

ڤەدکەن

تێهنێ ... نە پەراڤو نەدانانگەه

نارین

بێهنا تە ددەڤێ مندا سترانەکە

گەوریا من پر بوو ژچوونێ

نەدیاریێ

نەزڤرینێ

رویس و پێخواس ژدەنگێ تە دڤەرەسیێم و

سترانا من ژەنگی دبیت

ئێدی نەما ... شەر دەلیڤا سترانا بیت

هەمی رەڤێن

شەرڤان ... رەڤین

ئاشتیخواز ... رەڤین

ئەڤیندار ... رەڤین

بریندار ... رەڤین

بتنێ ما ئەز ..

ئەڤ باژێرە و..
وەریسەکێ حەوێس ژپەیڤان
ئەگەر تو بچی ... یان تو بهێی
گلیزێ غەریبی و غوربەتێ
تاما دەڤێ من تەر دکەت
وەغەرا تە ... با دسینگێ مندا کرە ئاڤ
ڤەگەراتە ... با دسینگی مندا کرە ئاڤ
ما یا فەرە ئێدی ئەز ژی وەك ئاڤێ بم
هەر گوننەهەك ب دیواریڤە هەلاویستی من یا کری
هزاران دۆزەخێن گەرم و دفن سۆتی من سارکرن
هێژ چاڤێن من لیلاقن ...ب سیڤاندێن بەهەشتێڤە
دەنگەك مینا دەزی .... بسمارە ئەنیا من دسمیت
گومانێن مۆر
پەهلە وانێن سەرابی یێن هێشتا ساڤا
پێشبینی یێن سور
د وەغەرەکا مۆرفینیدا سەمایێ دکەن
ئەز دێ جگارا هەرکێشم
دائێڤاری زوو ڤەگەریت
پە یڤ ...کریارەکا رویسە
شەڤ ... رامانەکا رویسە
دادەرگەهێ دلان ڤەکەین
ئەڤ سینەمە یا ڤالایە و...,
ئەڤ نارینا خەمۆکییا ب رەخ منڤە ... ئەز نانیاسم
ب هەمی هەستێن خوە یێن نازکڤە دگەل فیلمی
یا راهاتی و یابویە پشکەك ژ دیتنێ
ئەکتەر رۆلێ میری دگێریت
" جلکێن میری نەمیر ب خوە یە! "
من .. گومانەکا بن بر یا ڤێ
(ماکارینا ) وئەو سترانا خاپینوك یا دانەزانییێ
تایێ ل گەهێن من دچینیت
بێدەنگییەك یا دشهیت و پا شڤەرۆیی یا دگریت
ئەز ب گرنژم

یان ب تنگژم
بوشاییێ هەمی گازی یێن من ڤەخوارن
هێشتا غاردانیێ چا ڤێن من نەگرتینە
هەمی رەزێن خرابەکری ... دیێ گرنژن
هەمی مالێن وێرانکری ... دیێ گرنژن
تەڤ عەزیزێن پەناهندا و کوچبەرکری ... دیێ گرنژن
لیێ بێزاریا من دیێ مینیت...
ئوو بێزاری ... گرۆڤیێ بەردەوامی و ژینا منە
پەیڤێن من یێن ب ناڤسالڤە چوین
دڤیێ وەغەرا مۆرفینیدا
نە چ گول
نەچ کوتر
نەچ ماچێن ئە ڤینی یێن سترانەکیێ
پەهلەوانێن من یێن سەرابی سەرخۆش دکەن
سەوداسەرییەکا گوهشۆر و برینەك کوور
پشتا من یا کرییە سپیندار و خوەسەری ...,
یابوی بلوور
هەمی گوننەهێن من کرین ونە کرین
هەمی خەونێن من دگەل خوە ....رە ڤاندین و هێژ نە برین
گومانەکە ...
گومان ... دەرمانیێ چاڤێن کوور
ئەڤ سترانە یا نەشازە
هەمی پەیڤێن یاخی بوین وبو ینە جهۆر
شعرا منژی گومانەکە ...
گومانەك مۆر
*
2000

ئێشان ... خەریبیەکە بو رەهێن کوور

**ئەڤ مرۆڤە کار دکەن**
**ماموستا قوتابی فێر دکەت**
**جوتیار ... زەڤیێ دکێلیت**
**دارتاش کورسیکا چێدکەت**

**ئوو...**

**زارۆکێن چاڤ برسی یێن پرسیاران**

**پەپیکێن بەرزە بوویێن نێڤ بریاران**

**دەڤێ ما موستای قادشەو ,**

**هەمی جێ ژ ڤانێن پرت ... ب ئەنیا رۆژێڤە هۆرەبا**

**پێلێن خەما چیایەکە ... گەشە دکەت و ،**

**داکەفتنا خەون و جوانیا بەیدەبا**

**دبنە پەرێن گولچیچەکان و دکە ڤنە بەر با**

**کاتە ژبیردانکێ شین دبن**

**ئاوازەکێ هەمە رەنگ و سەرنجرا کێش بشکوژا دکە ت**

**بهێلە ...**

**گلیزی ژدەڤێ رووباران ڤەگرم**

**خویکێ ... ژ نەمرنا خوە یا ژبێ دەستی هەگرم**

**ئەز ... سە وداسەرێ هژیانا**

**کالە پیرێ سەرێ سێریانا**

**دێ دیرۆکێ هە میێ کپکەم**

**دەنگێ گیتاران دێ متکەم**

**هەر تشتەکێ خوون تێ بگەریت**

**ژیان تێ بیت**

**دێ راوەستینم ..., ڤەگەرم**

**دا ب ئێمنی ..., یادا تەیا گەش و پیر ۆژ**

**هێدی دبیردانکێ دا ب بوریت**

**ئەی روبێ ئاڤێ و ..., کوباریبا ئاسمانا**

**بەردە هەفسارێ خەونێن بیتا نوکی و,**

**بگرە دەرێ بێدەنگیێ**

**زارۆکێن ئاڤێ و هەتاڤێ**

**سترانەکا نیف تەمام یا دگەوریاندا هشکبوی**

بشكوژێن سۆزێ ... كاروانێ یێن رێكا ژڤانا
ئێكو ئێكو یێن وەریا ینە دپاخلا مندا و ...,
یێن بوینە خۆشیا سترانا
هە كو ..
كەزیێن دارچناران دهژیێن و
جۆكێن ئەڤینێ لسەر بەلگان شین دبن
ئەز هەست پێ دكەم
هەناسەكا گەرم , دفنا من دسوژیت و,
چاڤێن من یێن خەوتە دوی ددەت
هەكو ...
چیا ... دبن مژێڤە كورك دبیت و
سترانا سور , لالیا شەڤێ نە سمیتن
ئەز هەست پێ دكەم , پشێن من یێن بو ینە زیندان
ئوو برینەك كەڤنار ڤەددەت
ئەی كورێ گەرمێ و ..., شەیدایێ ڤۆلكانا
" ئەز دێ ناڤێ تە نەخشینم "
لسەر روبێ پەیڤا خێرێ و ..., دلۆپێن بارانا
ئەڤ زەمینە خوە لبن پێن من ڤەناگرێت
بێهنا ناڤێ تە بلووره ...
ئوو...
دویكێلا جگارا من ژی سنووره
دەمێ گول ... مریتویی دبن و ...
بە خچە
هێزارێن  ب شەرمینییەكا چێكری ,
ل كەزی یێن روحانا دئالینن
سەماییێن بریندار
هە ڤۆكێن جەهنەمی ژێ دبارن
ئێشان ... خەریبیەكە بو رەهێن كوور
كوڤان ... خەریبیە
خۆشی ... خەریبیە
ئوو.., خەریبی . ئێشانەكە ل دەمێ هوور
ئەی بەرهەمێ ئێشانێ ... دلێ زۆرانا

هەکو ...
کوترێن سپی ددەگرن
جۆکێن ئازاد وسیلا ڤێن کەزی برِی
دزڤرنەڤە دما لبچووکیێ رووباریدا
ژیان پەلاتینکە, دبژیێن شەرڤاناندا دنهییێت
هەمی شەرڤان
ئەوێن کەتی و ییێ ب سەرکەتی
ئەوێن مێر و ئەوێن بێخێر
خەونا ب گولێن سۆرڤە دبین
ئوو....
ئێڤاری یێن عشقیێ لسەر لێڤا رووباری
هەمی حەزێن نەپەن ... دبنە چووچك
تەمیێ ژئاسمانی ڤەدگرن
گولله ... دبنە گول
قەمە ... دبنە خامە
هەمی دووکێلا سۆتنیێ
شەڤیێ
کوشتنیێ
هەرفاندنیێ
چاڤێن رۆژیێ دهێلنە هل
لڤی وەلاتی
ژیان و نێرگز و بوهار
وەکو پشیکا ددەستیێ مندا دغای دچن
من چ جهیێ مرنیێ نینە و....,
ئەز نزانم چەوا بمرم
*
ـ پێگۆتنەك بو لۆزانیێ
دشەڕەکیدا
هەکو گول ... دل ... کول
هەکو ناڤ ... داڤ ... ماف
دجولاندکەکا درەویندا

تەشیا وەغەرەکا خەونێ درێسن
خوون ژ لەشێ زینێ دباریت
دوو برینن... نە, سێنە
سێ برینێن دەرڤەکری ... چاڤ زیق
هێڤ دکەنە گوللەیان و بەرکێن توپا
ئوو...
بەردەرێ خانیێ پاشای
نە چ بلبل دسترینن
نە چ رووبار گوننەهان دشۆن
کەربڤەبونەك سەربەردای , وەکو تایێ
گەهێن عاشقان خاڤ دکەت
هەوار ونالینێن زینێ
دەنگێ خۆشێ بلوورێیە لبەر گوهێ گای
ژێکڤەقەتیان خوشییەکە
وەك خۆشیا هەڤگرتنێ
ژهەڤدوور بوون پیلانەکە,
وەك پیلانێن هەڤدیتنێ
ببورە ... زینا من
ببورە
هەرسێ برینێن خویناوی و
هندەك برینێن بچووکێن هێشتا دخەو
دێمێ مەمۆی تۆرە
ئوو...
لەشێ تە هەلەمۆرە.

*

ـبروسکەکا بلەز ژکومتێ دەلانپەر
سێ هەڤال بوون
سێ برین بوون
سێ خەونێن بنەفشی یێن تەر و نازك
ژبرینێن زینێ ڤەبوون
سینگێ چیای کرە پەییسك

کومتیێ بلند هەمبێز کرن
سیێ مال دیتن
سیێ حال دیتن
سیێ ڕێڤنگێن کاروانەکیێ دەلال دیتن
ڕوندکا چاڤێن وان خوارن و
تەراخوۆما دناڤدا شین بوو
کەربیێ دلێن وان خوارن و
هەولدانەك ڕەنگین شین بوو
هنار دیتن و هنارۆك دیتن
دار دیتن و سێدارە دیتن
سەرکەفتن دیتن و سۆتن دیتن
ئوو...
سویند خوارن
سویند ب ئاخا ڤی وەلاتی
ب چاڤێن ڤی ڕوژهەلاتی
ڕەشمالەکا مەزن چێکەین
سیێ کاروانان سهیێ لیێ بکەت
ئوو...
دەم بوری
تەم بوری
خەم بوری
بریارە ڕێکیێ بەرنەدەن
ئەگەر بەردا ... گیانی بدەن
ژبلنداهییا ئەڤی کومتیێ دفن بلند
سیێ ئەلهوێیان شە ڤا تاری کرە ئەلند
با... شاهد بوو
هەناسا هەرسیێ هەڤالا
کرە ستڤانك بو گەردەنا پیرە سالا
سال ... هاتن
سال ... بورین
هەتا سالا...ئەڤ ستڤانکە کرییە ئالا
*

**– دەنگوباسەك ژچەمێ ئاراس**

رەڤین ... رەڤین

دیسا رەڤین

چووچکێن بەهەشتێ گورزێن جەهنە مێ و

گەرما پەقینێ

دلێن جوتیارا, جونیا بوهارا و...,

کومتێ شرینێ

داهیڤی ێین هەلاویستی بەلگا بدەن

دا عەڤرێن رەش ببن باران

هەرکومەك سالان دووبارە

پێنگاڤێن مە ... رەڤین ژێ دزێت

رەڤین ...مێرانییەکە وەك زڤرینێ

کەنین ... دناڤ گۆمێن راوەستایدا بێهێزیەکە

وەك گرینێ

کەنی و گری ...

دلۆپ دلۆپ ژ پرچا رەڤینێ دبارن و ..,

دبنە هەبین

**ـ بێهنڤەدانەك دگەل تەحسین تاهای**

" ئەم هاتین ...هاتین

ئەی بوهار دگەل ئێك

دگەل ئێك ئەم هاتین

ئە م هاتین ب خۆشی

ب خۆشی و سەیرانی

نە خوەشیا بو خوە ... بو خوە چێناکین "

**ئە ڤ مرۆڤە کار دکەن**
**ماموستا قوتابی فێردکەت**
**جوتیار .. زەڤیێ دکێلیت**
**دارتاش .. کورسیکا چێدکەت**

ئوو...

هە ڤالێ من ئەوێ حەوێس

ئەوێ ب بەر چاڤك

بە لگخەزامان ... خرڤە دکەت و بو پەیڤەکێ
یا پرچ گژاڤژ و بەردای دکەتە سیتافك
ئەی روحا پەیڤێ ... جەڤەنگێ هۆزانا
ئەڤێ هۆزانا بێ خەم وبێ گرنژین
یا بێ گیان و هەمی ژین
دێ زڤرینمەڤە دەسپێکێ و
"ل دەسپێکێ پەیڤ بوو..."
پەیڤ...
بونە گێسن
بونە زەڤی
بونە کەلا
بونە ئالا
بونە خەون
بونە کەون
کەون ژی ئەڤە دپانیا دەستێ مندا دنڤیت !
.
.
.
.
.
.
.
هێشتا یامایی !
*
2000

## سۆزەکا سەرمەدی

گۆتنەکا دچاڤێ مندا و کووراتییەك
سوتنەکا دسینگێ مندا و دووراتییەك
ئەڤ باژێرە ب دەنگێ لێدانا دلێ من هشیار دبیت و

سترانێن خۆش و ئەبەدی
بو چووچکێن سەرگەردانێن زەڤی یێن هشك وبێ باران و
مەلوول دبێژیت

خەونێن مۆرێن دلێ هیڤیا وبەرائەتێ
دڤێ شەڤا تەنا وتاڤهەیڤدا سەرخۆش دبن
ـ خەونێن سەرخۆش
ـ هیڤی
ـ بەرائەت
ـ زەڤی یێن بێ باران
سەرابستانا پەنجەرێن تە یێن گرتی
پەیڤێن من یێن شەرمین رویس دکەن
پێنگاڤێن من, ئەوێن کوشتی ...
ئەوێن بکوژ
ئێکو ئێکو ژناڤ دەهمەنا پشکێن جودایێن جورعەتێ
دزێن و ڤەدزێن ...
ژڤانێ من
ترپێن دلێ بیژنەکا ل هیڤیا ڤەکرنا دەرگەهی
هەمی لەشێ وێ بویە گوه
ئەی بارانا بهارێ و بشکوژێن دارنیسانا
ئەی خۆشیا ژیانێ و راماما ڤیانا
ئەی شنەبایێ زۆزانا
ئەی سۆز ...
سۆزا سەوزا سەوداسەرا سەرمەدی

قیبلەگەها...

کەسانێن نێر و زێبەقی
ئافرەتێن شەیدا و سەماکەر
بەلگێن پاییزی یێن نە وەریای
خەمێن ئاڤزێن گیانی

دەمێ سپێدە هشیار دبیت
گلۆپ گلۆپ ... بیرەوەری یێن ڤەمراندی, هەلدبنە ڤەو
ئەز هەست پێ دکەم ...
دەستێ مندا سورگولەکە و ئەز لسەر شاپەرێن حەزێ

بەرزە دبم ... خەونە

من گوهـ لێ دبوو ب دەڤێ خوە یێ گرێدایڤە

یادیێژتە من " ئەو رۆژا کو فەرە بهێت ... نا هێت "

خەونە

ئەزێ دوور

تویا دوور

دسەرخۆشیا ڤێ شە ڤێدا ...

پەیڤ یاخی دبن و گەوریا من یا هشك دبیت

هشك

هشك

هشك

ئاخ ... من چەند باران دڤێن

لێ.,, دڤێ شەڤا مشتی ستێر و سەرخۆشیێ دا

نە متیبا قولاچەکێ

نەهێلینا چووچکەکێ

نەهەمبێزا نەرم و نۆلا باخچەیەکێ

جهێ لەش وگەرمیا هەناسا مە ناکەت

دڤی  فەزاییێ بێ داویدا ... دەربەدەرین

پەیڤ

هیڤی                    ... خەندقین

جه

دیدە

یا دێ چەوا گوننەهەکا کەسك ئەنجامدەم ؟!

ئاخ... من چەند توفان نەڤێن

دڤێ توفانا تەنا دا

ژلەشێ تە ئاڤ وتەهارەت دباریت

دێمێ تە ژی ...دەنگێ دەهۆلەکا دوورە و ,

دەهولا دوور ... خەوێ ژچاڤێن من سل دکەت و

خەما مۆرە

هەمی خانێن لەشێ تە یێ نال نالێ دکەن ...

من گوهـ لێیە

حەزا پر ئاگرینا من پێ دئارییێت و

**یاریا ب پرچا بای دکەتن**

**بەهرەیەکا پاشکەفتی یا شەبەحییە ...**

**ئەڤ حەزاهە**

**دنەهشیێ دا سیتافکە و ... دئەزا مندا گوناهە**

**لێ ...,**

**ژنشکەکێڤە, بلەزتر ژدەنگی ... ژدەنگێ رووت**

**ژ بێ دەستی ... ماچەك ژ دایك دبیت و ڤێ ماچێ**

**سەرێن مە پێکڤە کرنە جووت**

**من ئەو ماچا ئەرخەوانی و هەناسەکا گەرم و بلەز**

**دا دەستێ بای**

**با ... خەمێن عشقێ هەلدگریت و ددەتە بای**

**ما کیژ عەڤرێ پر بارانێ ڤێ ژیانێ ؟!**

**رائێخەکا سحربەندە کو لەشێ مە دگەرمێ وەرکەت**

**گەرم ...**

**خوداوەندەکێ یاخییە و ددلێ مندا شەوقێ ددەت**

**ئەز و دیونیسیس**

**دڤێ شەڤا بێدەنگ و سەرخۆشدا**

**ئوبە ئوبە ... خەما سار دکەین و سترانا بو بای دبێژین**

**دیونیسیس ... دپێکەکێ مەیدا حەلیا و ئاگری بر**

**ئەز... دناڤ خەندا مەمکێن تە یێن شیر نە دیتی دا ...,**

**حەلیام و فەزای برم , کرمە ددەستێ خلوەییێ دا**

**- تو**

**ـ مەی**

**- ئاگرەکێ مشتی شەهوەت**

**گەش دبن و بلند دبن و دبنە ئاسمان**

**دەمێ دبوهارا بهێت دا ... هشیار دبم**

**چبك چبك ژ داڤێن پرچا تە یا جوان**

**خوناڤ دباریتن ڤیان**

**ئەز دزانم تویا ل هیڤیا بارانەکێ**

**زەڤی یێن تە یێن هشك ماچی کەت**

**هەمی بوهار ستوێ من دگرن ...**

**ئەز بارانم**

*

2000

## سیٚ پەستە ییٚن خەریبییٚ بو چیاییٚ شنگاریٚ

(1)

حەزەکا گەرم و ئارپای
بو زەرزووری و ..ل کوپا چیایەکی دادای
نە رەنی ییٚن بەفریٚ
نە گوٚریا ئاگری
نە رەشماریٚن لسەری بادای
نەکارینە کانی ییٚن ئاڤیٚ شیٚلی بکەن
سرِیٚ .. ل دیٚمیٚ هاڤینیٚ بچینن
هەمی هەستیٚن ئەخیلی ییٚن تیٚك ئالاندی
ب کوریا روٚژیٚڤە کورك دبن و ...
دناڤ پەنجیٚن کەرب وکینا ئەڤینییٚ دا
خەنجەریٚن دەڤ تیژ ژیٚ دزیٚن
.
.
.
بارنە کا ئیلوونی بوو
دەمیٚ حەزیٚن ئەدونیسی پیٚژن نە ماین
شمشیٚر برین
قریٚژیٚن چاڤەریٚ برین
سونبلیٚن زەر ژ زەڤی ییٚن نفستی شین کرین

بەفر هات و پرچا چیای کره هێلێن
گەرم هات و سینگێ چیای کره ئێتوین
بەفرێ بارکر .. لێ چیا ما
گەرمێ بارکر .. لێ‌چیا ما
سەهمێ ستوێ خوە خویل و خوارکر .. هەرچیا ما
چیا ..
ب ئەنیا ئەردیڤە مەزن بوو
چاڤێ زەرزووریێ کونکر و تێدا نهی
ئەو زەرزووریا ناڤێ وێ حەز
ژ پەیڤێن ژێکڤەقەتیای وسل ...
شین بون نژیار
هەمی بەیار کرنە بوهار
ئوو..
ژ دەهمەنا چیایی ڤەبوو
گولەکا گەش .. گۆتنێ شنگار.

(2)

من وئەڤینیێ گۆت بوو ئێك
کو خەریبی دەرازینکا مە ماچ نەکەت
ئەڤینی .. دووگیان دبیت و،
لسەر دەستێ خاتوونا فەخرا حەز ژێ دزێن
حەزێن مە بونە دارچنار
لبەر لێڤا رووباری شین بوون
رەهێن رووباری .. دخوونا مندا ڤەژین
رووبار..
رووبار ..
کەلەکێن کەڤن و چیرۆکێن تەڤن
خەلەکێن بادای و دیرۆکێن دادای
بویەرێن رەش و هەڤۆکێن گەش
ئاورێن شەرمین و بیرۆکێن رەشبین
تبلێن رووباری
رێژگەهـ دمێژن

مەهمەدرەشا گرۆڤیێ خورتییا دێرینە و ئەڤە ژمێژە
گوننەهیێ ژچاڤێن وی درێژن
ئەز چ بێژم ..کەلا خەریبییێ
پەرداغێن عاشق وڤالا .. ل بەندا سالا
خوها رشتی ..
ژ زڤری وپەقێن دەستیێ پالا
چاڤێن دەرا و دەرازینکێن هەمی مالا
زڤێل زڤێل روندکێن خوە کوم دکەن و ,..
ب تەشیا رووباری  درێسن
کو رۆژەکیّ ببیتە ئالا...
ئالا
ئالا
ئالا

(3)

توب خودیێ کەی حەبکەکا سەرئێشیێ بدە من
سەریێ من ییێ بویە دەنگیێ دەهولەك دوور
ژان ییێ دهێنیێ
قێژی یێن ئێشانیێ .. مزگینییا زانیێ دبێنیێ
ئێشان .. خوٚشییە
خوٚشی .. لەززەتە
لەززەت.. دەولەتەکا سەربەخوٚیە
ئەگەر مەژی دەولەت هەبا
پیّنگاڤێن مە.. دا ژیێ بن دارێن هنارا
پاپوٚرێن مە ..دا دادەن لێڤێن کنارا
زاروٚکێن مە .. نەدمان خازوٚك وئێڤەلی لبەر دیوارا
ئەگەر مە ژی دەولەت هەبا
مە ژئێکو دوو ماچ نەددزین
دزیندانانداا لەش نە درزین
دلبەرا من .. ئەوا چاڤکەسك
دا دباوەشا مندا نڤیت وسترانێن خوٚشییێ بێژیت
بو ئەڤروٚکە و پاشەروژیێ

ئا دارێ و ئاگرێ نەورۆزێ
بو سیبەرێ و بو  شنەبای
بو ئاشتییێ و هێزا چرای
کوتر .. یێ کارێ خوە دکەن و
کەزیا دڤەهوینن هەمی رێك
هەتا مەژی دەولەت هەبیت
چاڤە رێ بن
ل پالا چیایێ شنگارێ بگەهینە ئێك .

*

2001